# لێکدانەوەی هۆنراوەی لامیە لەبیرو باوڕدا

## دانراوەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە

لێکدانەوەی

م. مەبەست کاژاوی

نوسینەوەی:

ئیراهیم ئیسماعیل



# لـێـكدانـەوەی مـەنـزومـەی

# {الـلامية في الـسـنـة}

## لــە بيرو باوەڕی ئــەهلـی سـوونـنـەت و جــە مــاعــە

نوسينی: إبراهيم إسماعيل



## {پێشەکی}

## {بسم الله الرحمن الرحيم}

ئەم( منظومه) مەنزومەیە لە(16) شانزه بەیت پێکهاتووه، ناوی (اللامیة) بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی پیتی (الروي) تێدا نیە، لێکدانەوەی مەنزومەیەکی زانستی لەسەر بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بە ناوی { اللامیة في السنه } لە نوسینی شێخ إسلام ابن تیمیە( الله تعالی لێی ڕازی بێت) کە مەنزومەیەکی کورت و پوختە کە باسی بیروباوەڕی ئەهلی سوونەت و جەماعەتی تێدا کۆ کردۆتەوە وە دەست گرتن بە قورئان و سوونەت و بابەتی ناو سیفاتەکانی الله تعالی و فەزڵی هاوەڵان باسی دۆزەخ و بەهەشت و باسی مەزهەبەکان و وە باسی بیرو باوەڕی گرووپەکان.... هتد.

کە بە شێوەیەکی کورت و پوخت لەم مەنزومەیە هێناویەتی و باسی کردووە ئێمەش بە شێوەیی کورت و پوخت بە ئەندازەی بچوکی مەنزومەکە بە نوسین و لێکدانەوەیی پوخت و جوانمان بۆ ئەم مەنزومەیە کردووە، داواکارم لە الله تعالی بە نیەتێکی پاک لێمان وەرگرێت و بیخاتە تەرازووی چاکەکانمان داواکارم لە الله تعالی لەسەر ئەم ڕێگا ڕاستە تەوحید و سوونەت ژیان و مردنمان پێ ببەخشێت وە ئێمە و گشت خوێنەری ئەم مەنزومەیە.

ئەم مەنزوومەیە بە کورتی لە شەرحی م.مەبەست کاژاوی دەرهێنراوە.

## {كورتـــەيەك لـە ژيانی شێـخ إســـلام ابـن تـيمـيه}

- نـــاو و نـــەسەبی:_ شـێخـی ئیـسـلام ئـەحمەد كوڕی عبدالـحليم كوڕی عبدالـسلام كوڕی عبداللـه كوڕی تەيميـيـەی حــەڕانی.
- له دايك بوونی:_ لـــە ســاڵی (٦٦١هـ) كۆچی لــە دايك بــووه.
- ڕۆشنبيری ئيبن تەيميه و ڕێـبازی له لێكۆلينەوەدا:_ ئيـبن تەيميه شـارەزاييەكی بەرفراوانـی لـــە زانسـتـە شـــەرعی و عــەقليەكاندا بـە شێوەيەكی يەكســان هـەبووە، زەهــەبی له بـارەيەوە دەڵێيت: ( لـە زيرەكيدا هـەڵدەگيرسا و زۆر گــوێی لــە فـەرمـوودە دەگــرت و زيـاتر لـــە دوو سەد مــامۆسـتـای هەبـوو لـــە شــارەزايی تەفسـيردا گـەيشتبووە ئـەو پەڕ و لـە لـەبەركردنی فەرموودە و پياوانی فەرموودە گێڕاوە ڕاستـی فەرموودە دا كـەس پێ نــەدەگـەيشت، لــە وەرگــرتنی فيقـهـ مـەزهـەبـــكـان و هــاوەڵان و شوێنكـەوتوان (تــابعين)دا وێڕای چــوارِ مەزهــەبەكەش هــاوتـای نـەبوون، لـــە بـارەی جيـهـاد و پێشرەويشەوە لـە سنوری وەسفدا نـەمـابوو، ئـەو تـيـادا بــە تەواوی شـوێن بەرنــامەی ئـەهلی سوننـەت و جــەماعە كـەوتووە، بــە تــايبەت ڕێبازی پێشــەوا ئـەحمەدی كوڕی حــەنـبــەل و گـەورە زانــايـانی حــەنـبـلی.
- كـوچی دوای كردووه :_ لـــە ســاڵی (٧٢٨ هـ) وەفــاتی كردووه.
- قوتابيـەكانی:_ ئيبن قەيم جوزی _ ئيبن كـەثير_ ئيبن ڕەجەب حەنبەلی....هتد.
- پـيشـەی:_ فــەقێـهـ.
- زمــانی:_ عەرەبی بووه.
- كاری كردووه لـە بـــواری:_ زمـــانی عەرەبی_ فەقێـهـ _ أصول فقه_ حديث_ تەفسير....

پـێـنـاسـەی (المنظومه الـلامية في السنه) :

وشــەی (الــمـنـظـومـة) شــەریـفی جورجـیانی دەفـەرموویێت:_ لــە (نــظـم) هــاتووە لــە زمــانـی عەرەبـی واتــە (جـمـع الؤلؤ في السلـك).

١_ **واتــە**: کـۆکـردنـەوەی لـو لـوە ئـەوەی دنــک دنــک لــە ڕێـگـا کـەوتــووە لــە پـێـنـاسـەی زانـایـان واتــە: (تـألـیـف الـکـلـمـات والـجـمل مترتـبة الـمعـاني).

٢_ **واتـــە**: تـێـک خستنی چـەند وشـە و ڕستـەیــەکـە کـە بینا کـراوە لــەســەر واتــا.

- وە وشــەی ( الــلامـیـة ) واتــە: پـیـتـی( ل ) کـە کـۆتــایی دێــرەکـانی ئـەو مــەنــزومەیە بە پیتـی ( ل ) کـۆتـــای پــێ هـــاتـووە گـەر سـەیری مــەنزومـەکە بـکـەیت بـە ڕوونــی دیــارە، وە ئێـمە هاوشێـوەی ئـەو جـۆرە مـەنزومـەمـان هـەیە کـە کـۆتـایـی وەزنــی مـەنــزومـەکـە بە پـیتێـک لـە پـیتـەکـان هــاتـووە وەک:_ {مـەنـزومـەیی الــحـائیة ئیبن داود، وە نــونـیــەی ئیبن قـەیم}.

- وشــەی ( في الـسـنــة ) **واتــە**:_لـــە بـیـروبـاوەڕی ئــەهـلـی سوونـنـەت و جــەمـاعـەت.



## {بِســم اللَّه الــرحــمن الــرحيم}

### {بركة الوقت والعلم والتعلم عند شيخ إسلام}

١_ يـَا سـَائِيلى عَنْ مَذهَبِي وعـَقيدَتـِي**رُزِقَ الـهـُدَىٰ من لِلهِداية يَسأَلُ

### {زانست و فێربوون لـه سەردەمی شێخ ئیسلام}

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموویت: ( یـــا ) ئـەمــە حــرفی ( نــداء) بــانگ دەكـــات.

( یـَا سـَائِیلی ) یـانی ئـەی ئـەو كـەسـەی كـە پـرسـیـارم لـێ دەكـەیت دەربــارەی مــەزهــەب و عــەقیدەی مــن ( یـــا ســائل ) وەک پـرسـیـارێک بــەكـاردێت ، داوای شتێک دەكـەیت وەک داوای خــواردن بێـت یـــان عــلــم ، لێـره شێخ ئیسلام مەبەستی داواكردنی علم

داواكـردنی علم یش دەبێت بـە دوو بـــەش.؟

١_ (سؤلی متعلم) كـەسێـک پـرسـیارت لــێ دەكـات كـەسێـكی (متعلم) دەیەوێت فێربێت

٢_ (سؤلی مـعـلم) كـەسی وامــان هەیە كـەسێـكی ( معلم ) بــۆ علم پرسیــارت لــێ نـــاكات كـەسێكی سـەر سەختـە تـەنـهـا بۆ بـەر بـەچ دانـــەوە ئــەو پـرسیارەت لـــێ دەكـات یـــان بۆ هەڵـخـلـیسكاندنی تــۆ.

_بەڵگــەی قورئانی پیرۆز الله تعــالی دەفەرمووێت:_ (فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) **واتــە**: جــا ئەگەر ئێوە ئەو ڕاستییەتـــان نـەزانیـوەو نـكوولّی دەكـەن، دەسا فەرموون لەو جوولەكەو فەلانەی زاناو بەئاگـان لە بـەڵگـەو كتێبەكـان بپرسن، سورەتی النحل:43.

بەڵگە (الحديث) نموونە بۆ كەسی( متعلم ) كە پرسيار دەكات ، يەهوديەك پرسيار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەكەن دەربارەی (ڕوح) ، جارێكيان يەهودەكان كۆبوونەوە وتيان ئێستا ئەچين پرسيارێك دەكەين وەڵامی پێ نييە وەك بۆ بەر بەج دانەوەيەك بێت پێغەمبەر (ﷺ) پرسيارەكە دەرابارەی (ڕۆح) الله تعالی خۆی ئەزانێ عەقيقەتی ڕۆح چيە علم يش كە الله تعالی پێی داون شتێكی زۆر كەمە.

**ئەو دوو جۆر پرسيارە هەبوون:**

(عَنْ مَذْهَبِي) يانی مەزهەب و مەزهەبايەتی لە سەردەمی (صحابە) هەوەڵان دا نەبووە ئا ئەم مەزهەبيە موسڵمانانی تەفرەقەكرد و پارچە پارچەی كرد هەتا ئەم سەردەمەيە موسڵمانان ئەناڵێنن بە دەست مەزهەبايەتی كە لە كۆنە دروست بووە هەتا ئێستا كە دەمارگيريان هەيە بۆ مەزهەبەكان كە يەكێ ئەڵێ مەزهەب شافعی يەكێ ئەڵێ ابوو حەنيفە هەتا يەكێ لە زانايان ئەفەرمووێت ( لە هندستان مەزهەبی شافعی كچ نادەن بە مەزهەبی ئەبوو حەنيفە يەكتری ناخوازن) دەمارگيريان گەيشتە ئەم رادە ژن لێك نەخوازن، لە سەردەمی (صحابة) هەوڵان كەس نەبووە بڵێت من مەزهەبەكەم عومەری كوڕی خەطاب يان علی كوڕی ئەبوو طالب ئەوان چی بڵێن من جێ بەجێی دەكەم، بەڵكو قسەيان لێ وەرگيراوە، مەزهەبايەتی نەبووە لە ئيسلام دا و بەڵكوو ئەمە شتێكی زيادكراوە (بيدعەيە)، پێويست و واجب نيە لەسەر موسڵمان كە پەيوەست بێ بەم چوار مەزهەبە و يان غەيری ئەم چوار مەزهەبە بەڵكو واجبە لەسەر موسڵمان شوێن قورئان و سوننەت بكەوێت لە هەر كوێيك بێت.

جائيز نييە بۆ موسڵمان كە دەمارگيريمان هەبێ بۆ يەكێ لەم مەزهەبانە لە هەموو باسەكان و مەسائيلەكان كەسێكی كوێرانە شوێن دين كەوتووە، وەك{شيخ محمد كوڕی

عبدلوهاب} له سەرەتای کتاب (أصول الثلاثه) دەفەرمووێت: علم یانی ( مَعْرِفَةُ اللَّهِ ، ومَعْرِفَةُ نَبِيِهِ، ومَعْرِفَةُ دِينِ الإسلَامِ بِالأَدِلَّةِ ).

**واتە**: { ( العلم )زانست یانی ناسینی الله تعالى و ناسینی پێغەمبەر ﷺ و ناسینی دینی ئیسلام بە بەلگەوە}،

وە بە شەهادە ( أَشْهَدُ أَن لاَ إِلٰهَ إِلاَّ الله و أَشْهَدُ أَنَّ محمد عَبْدُهُ و رَسُولُه ).

شەهادە ئینجا ( لا إلـه إلا اللّه ) **سێ جۆر تەوحیدمان هەیە:**

١_ یەکخواناسی لە پەروەردگارێتی( التوحيد في الربوبية)

واتە:_ باوەڕهێنانێکی ڕاستەقینە بەوەی تەنها الله بەدیهێنەری پێ گەیەنەر و بە خێوکەر و کاروبار بەڕێوەبەری گەردوونە، غەیری ئەو هیچ کەسی تر توانای نییە، واتە الله تعالى بەیەک زانین لە ڕێگەی ئەوەی کە الله تعالى بە تەنها بۆ خۆی (خالق _رازق_ مالك _ محي_ مميت_ضار_ نافع_مدبير الامر) واتە الله تعالى بە دیهێنەر و ڕۆزیدەر خاوەن و ژێنەر و مرێنەرە یان گەیێنەر و یان سوود گەیێنەر و کاروبار بەڕێوەبەرە.

٢_یەکخواپەرستی_پەرستراوێتی(التوحيد_الألوهية)واتە:باوەڕهێنانێکی ڕاستەقینە بەوەی الله خوایەکی حەقە و هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە بپەرسترێت و ملکەچی ببیت و خۆت تەسلیمی بکەی.

٣_ یەکخواناسی لە ناو و سیفاتەکانی (التوحيد في الأسماء والصفات).

**واتە**: دڵ دامەزران و دانپێدا هێنانی تەواوە کە بەس الله تعالى خاوەنی هەموو سیفەتە بەرز و تەواوەکانە لە هەموو هەڵە و پەلەیەک دوورە، وە ئیسپاتکردنی ئەمە بە کردارە، وە دەبێت هەموو ناو سیفەتێک کە الله تعالى بۆ خۆی دیاری کردبێت یان پێغەمبەر ( ﷺ ) دانی پێدا هێنابێ لە قورئان و سوننەت هاتبێ، دەبێ بۆ الله تعالى

بکرێت بەبێ تحریف، واتە نابێ دەستکاری ناوەکانی بکرێ و تعطیل واتە لە کارخستن و تکیف ، چۆنیەتی و تشبیه، واتە چواندن.

کە ئەڵێن( أَشْهَدُ أَنَّ محمد عَبْدُهُ و رَسُولُه ) ئەمەشیان تەوحیدی متابەحەی تێدایە ( لا معبود بحق إلا رسولا الله ) هیچ کەس شایەنی شوێن کەوتن نیە بە حەق جگە لە غەیری پێغەمبەر ( ﷺ ) کەس نەکەینە پێشەوا و پێشی کەوین جگە لە پێغەمبەر ( ﷺ ) هەتا تاک تاکی سەحابە جائیز نیە بلێ من شوێن ئیمامی عومەر دەکەوم لە هەموو شتێکە کە وات کرد تۆ شایەتیت هەڵدەوەشێتەوە، ئەبێ بلێی غەیری پێغەمبەر کەس شایەنی ئەوە نیە شوێنی بکەوم ببێت بە ئیمام و شوێنی بکەوم.

❖زۆر گرینگە (طالب علم ) ئەمە بزانێت خیلافی بەینی عولەما لە چیەوە سەری هەڵدە.

-کەسی عەوامی وامان هەیە ئەڵێ ئەو عولەمایە وای وتووە ئەوە وا وت ئەمە هەڵەیە بەڵکو دەبێ (طالب علم ) بزانێت خیلاف لە چی سەری هەڵدە ئەوە بووە کاتی خۆی کە شتێکیان وتووە و نوسیووە علمیان پێ نە گەیشتووە بۆیە فتواکەی بەوە داوە یان پێی گەیشتووە لە ڕێگایەکی (ضعیف)ەوە نەی کردۆتە بەلگە یان کردوویەتی بەڵام لە ڕێگایەکی (ضعیف)ەوە، بۆیە دەر نە کەوتووە کە (ضعیف)ە ئەمە (عوزری هەیە) کە زانایان دێن لە دوای ئەو ڕونی دەکەنەوە ئەڵێن (ضعیف)ە، بۆ نموونە شکانی دەست نوێژ بە گۆشتی حوشتر ئیمامی شافیعی ئەم بەلگەیی پێ نەگەیشتووە، ئایە لە سەردەمی شافعی هەموو (حدیث) فەرموودە کۆ کرابوویەوە جەمعی (حدیث)کرابوو...؟

نەخێر.

١_کاتێ کە خیلاف هەیە لە نێوان عولەمایان ئەوەیە کە بەلگەیی پێ نەگەیشتووە یان بەلگەی پێ گەیشتووە بە (ضعیف)ی.

٢_ یـان پێی گـەیشـتووە بـەڵام بـیری چووە ئـەویش مرۆڤـە بـیری چـۆتـەوە جـا ئـەم کاتە فتـوایەکی داوە بـیری نەبووە ئینجا کە زانـایەکیتر فتوای داوە ئەبینێ ئـەم مخـلافەیە بـۆیە ئـەوە بـۆتە هـۆ و سـەرچاوەی ئەو خیلافەیە لـە بەینی زانـایاندا هەیە،

٣_ تێگـەیشتن لـە بـەڵگـەکە بە پێچـەوانـەی مـەبـەستەکە چـەند گرینگە ئـاگـاداری بـەڵگـە بین ،لـەم گرینگتر ئـەوەیە ئـاگاداری قسەکانی الله تعالی پـاشان پێغەمبەر ( ﷺ ) بین کە چیە سەبارەت بـەم بەڵگـەیە وەک شافعی (الله تعالی لێ ڕازی بیت) دەفەرموویێت: { ئـیـمـانـم بـە الله تعالی هێناوە ئـەوە کە هـاتووە لـەسەر مەبەستی الله تعالی کە چۆن مەبەستی بووە لە ئایەتـەکـان چونکە ئێمە (حدیث) فەرموودەمان هەیە پێغەمبەر ( ﷺ ) لـە مـەبەستەکەی هەیە بـەڵام زانـایان هـەڵە تێدەگـەن لـە مـەبەستەکەی ئـا ئـەمە بووە بە خیـلاف لە نێوانیـان.

**بۆ نموونە** لـە فەرموودەیەک ئیمامی شـافعی بە شێوەیەک تێگـەیشتووە ئیمامی ئەبوو حەنیفە بـەشێوەیەک تێگەیشتووە ئەو جۆرە فرە تێگەیشتنە بـۆتـە خیلاف لـە نێـوانیـان هەر یـەکەو فتوایەکیان داوە،

٤_ هـەیە هیچ نـازانێت سـەبارەت بە قورئان و سوننـەت وەک سەرەتـای ئیسـلام گـەر گۆشتی کولات بخواردبا هەر گۆشتی بـەر ئاگر بکەوتبا ئەبووە دەست نوێژت بگرتباوە دوایـە نەسخ بۆتەوە هەبـوو زانا نەبوو بەمەوە فتوای داوە بـەڵام زانـایەکی تر هاتووە ئەوەی بۆ نـەسخ بۆتەوە حـەکسی ئەوە فتواکەی داوە ئـەمەش بـووە بـە خیلاف.

( و عَقیدَتِي ) لـە للغة وەرگیراوە لـە (عقد) یـانی شتێک ڕەبت کەیت بـە شتێکەوە ئـەمە عقدە، جـا دوو جۆرە عەقیدەمان هەیە عەقیدەی (صحیح) ڕاسـت و عەقیدەی بـاطل و فاسقمـان هەیە عەقیدەی ڕاست بنەماکانی ئـیمان:

١_ بڕوا بون بە الله تعالی.

٢_ به فریشتەکان.

٣_ به کتابه ئاسمانیەکان.

٤_ بـه پێغەمبەران.

٥_ به ڕۆژی دوای.

٦_ به قەزاو قەدەر.

ئــەو عەقیدەی سەحابه و سەلــەف ، وه عەقیدەی شێخی ئیسلام ابن تیمیه که عەقیدەی سەلــەف و سونــنــەت بــووه وه لــەگــەڵ کتــاب ســەلەفــی ســالــح ڕۆشتووه وه ئــەبێ ئاگــاداری فیرقــه گــومراکان بین وەک جەهمیه و سۆفی گەر و.... هتد.

جەهمیـەکان : بــه ڕوونی دەڵێن : قــورئــان دروستکراوه , کــەلام دروستکراوه ، نــاڵێن قــورئــان کــەلامی پەروەردگــاره.

موعتـەزیلیـەکان:_ کەلام پــاڵ دەدەن بــۆ لای پەروەردگــار بــەڵام لـه ڕوانگـەی دروستکراو بـۆ لای دروستکەر.

١_توشی گــومرای دەبن چونکه شوێن کــەسێ دەکــەون بێ ئەوەی بزانن هەڵەیان نا هەموو شتێکی لێ وەر ئــەگرن.

٢_ دەمــارگیریان له شته هەڵەکان که باب و باپیریان لەسەر بوون وا ئــەزانن دین ئەوەیه له باب و باپیریان بۆیان ماوەتەوه.

( رُزِقَ الـهُدَیٰ مـن لِلهِدَایةِ یَـســأَلُ ) ئــەوه دوعــایه دوعــا دەکات شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیه (الله تعالی لێی رازی بێت) ( رُزِقَ الـهُدَیٰ ) یــانی الله تعالی رزقی هیدایەت بدات به کێ بدات..؟

بـه ( مـن لِلهِدَایةِ یَـســأَلُ ) بـەو کــەسەی به شوێن هیدایەت دەگــەرێت داوای هیدایەت دەکــات ئــەمه دوعــایه به هیدایەت و ئیستیقامەت لەسەر ڕێگــایی ڕاست ئــەم ڕێگــایی که سەلەفــی ســالحی لەسەر بووه وه بــۆ کــەسێ تــا

داوا بکات و لێوەی فێربێت کرداری پێ بکات و خەڵکیش فێر بکات ،وە برای موسڵمان بـۆ برای خۆی وەک پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرموێت دوعایی برای موسڵمان بۆ براکەیی خۆی کە ئاگایی لێ نیە قەبولە الله تعالی قەبولی ئەکات لەلایی سەریوە مەلائیکەتێ وەستاوە ئیشی ئەمەیە کە هەر کەسێ دوعای خێر بۆ براکەی بکات ئەم ملائیکەتە دەڵێت(آمین) وە بۆ تۆش بە هەمان شێوە ( برا و خوشکی موسڵمانتان لە بیر نەکەن لە دوعایی خێر ).



پاشان شێخی ئیسلام دەفەرمووێت:

**{ الفرق بين السماع والاستماع }**

٢_ اِسْمَعْ كَلاَمَ مُحَقِّقٍ فِي قَوْلِهِ** لاَ يَنْثَنِي عَنْهُ وَلاَ يَتَبَدَّلُ

( اِسْمَعْ ) یانی گوێ بیست بە گوێ بیستێکی گوێ ڕایل نەک تەنها ببیستی و لێ تێنەگەیت ( قال سمع وطحنة ) وەک گوێ بیست بوونی سەلەف گوێ بیست ئەبوون و شوێنی ئەکەوتن، نەک گوێ بیستێک کە گوێ بگرن و ئینجا پشتی تێ بکەن.

( كَلاَمَ مُحَقِّقٍ فِي قَوْلِهِ ) یانی کەلامی کەسێکی ڕاست کە شوێن کەوتووە ( فِي قَوْلِهِ ) یانی گوێ بیستی قسەیی کەسێکی ڕاست بە لە قەولەکەیی.

( لاَ يَنْـثَـنِي عنَـــهُ وَلاَ يـتَـبَـدَّلُ ) يـــانی هـەڵەی تێدا نیــە وە گـۆڕان کاری بەسەر دا نـــایە، ئـەو عەقیدە کە عەقیدەی ئـەهلی ســەلەف گـۆڕان کاری بـەسەر دا نــایە لـەسەردەمی سەلەف و تــا کۆتای لەسەر ئــەم عەقیدە ڕاستەن و هیچ گۆڕانێکیش ڕوو نــادات، کە خیلاف و پێچوانەی ئەهلی بیدعە و وەک پەت پەتێن هەر ڕۆژە و لـەسەر پەتێکن بـەردەوام لـە گـوماندان، هەندێک لە ئەهلی بیدع هاتن بۆ لای ئیمامی مالیک (الله تعالى لێی ڕازی بێت) هــات و وتی ئیمام وەرە با مناقەشە بکەین لەسەر دیــن چونکە لە ئەهلی بیدع بوو ، ئیمامی مالیک (الله تعالى لێی ڕازی بێت) فەرمووی:_ مـن لـەسەر دینی خـۆمم بـەردەوام بـۆ هەمیشە بــەڵام تـۆ بەردەوام لــە گـومـان دایت بـڕۆ بۆ لای کەسێکی گومانــاوی وەک خــۆت منــاقەشەی لەگــەڵـدا بکە الحمدلله من دینەکەی خــۆم ئەزانم و کە ئەمە حەقــە بـەڵام تۆ هەر ڕۆژەو لەسەر پەتێکی بە گومانایــی بڕۆ منــاقەشە لەگەڵ کەسێکێ وەک خۆت لـە گـومــانا بێت بـەرامبـەر بــە دین، واتـە ئـەو دین و ئـەو مەنـهـەجی سەلەف گـۆڕانکاری بەسەر دا نــایەت،



**{ حــب صحــابة وفضلــهم }**

٣_حُبُّ الـصـَّحَابَـة كـُلـِّهِـمْ لـِيَ مـَذْهَـبُ***وَمـَوَدَّةُ القـُربـىَ بـِهـَـا أَتـَوَسَّلُ

( حُبُّ الـصـَّحَابَـة ) شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیە دەست پێ دەکات لـە دوعــا گرینگـەکان بــاس لــە خۆشەویستی سەحابە دەکات ئەفەرمووێت:_ خۆشەویستی سەحــابە (لـِيَ مـَذْهَـبُ) مــەزهەبی منــە، ســەحــابـەش ئــەم

کەسەیە گەیشتووە بە پێغەمبەری الله ( ﷺ ) _بەڵکو گەیشتووە نەک بینی بێتی چونکە سەحابە هەبووە نابینابووە ئەبێ بڵێین سەحابە نییە چونکە نەی بینیوە..؟ نەخێر، بەڵکوو پێی گەیشتووە پاشان ئیمانی پێ هێنابێت چونکە ( ئەبوو جەهل)یش گەیشت بە پێغەمبەر ( ﷺ ) بەڵام ئیمانی پێ نەهێنا.

-هەیە گەیشتووە ئیمانی هێناوە بەڵام دوایە گومرابووە ئایە ئەمە پێی ئەڵێن سەحابە؟ نەخێر، بەڵکوو دەبێ لەسەر ئیمان مردبێت و سەحابە و بووە و گەیشتووە بە پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیمانی پێ هێناوە _ دوای مردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) دووبارە گومرا بۆتەوە ئینجا ئیمانی هێناوەتەوە بەمە ئەوتری سەحابە؟ ئەوە بۆتە خیلاف لە ناو زانایان بەم ریدەی کە(نسخ) بوو بێتەوە بەڵام لە رای راجح دا هەر پێی ئەوترێت سەحابە والله اعلم بالصواب.

ئیمامی مالیک (الله تعالی لێی ڕازی بێت) کە باسی کۆتایەکانی سورەتی (الفتح)دەکات کە الله تعالی لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویت: ( مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ) کۆتای سورەتی الفتح/29.

**واتە**: موحەممەد ( ﷺ ) رەوانە کراوو پەیامبەری خوایە، پێیان خۆش بێت، یان نا ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو کەوتوون لە بەرامبەر بێ بڕواکانا ئازاو بەهێزن، لەناو خۆشیاندا میهرەبان و بەسۆزو دڵ نەرمن، وە لە فەزل و گەورەیی هاوەڵاندایە ئەم فەرموودەیە هاتووە: (لا تسبوا أصحابی فو الذي نفسي بيده ! لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهبا ما أدرك مد أحدهم ولا نصيفه ) مسلم : 1967/4. **واتە**: جنێو بە هاوەڵانم مەدن، سوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە! ئەگەر بە ئەندازەی چیای ئوحود، ئێوە زێڕ ببەخشن ناگاتە مستێکی، یا نیوەی ئەوەی ئەوان.

( لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ) الفتح/29. **واتە**: خوا ئاوا بە ئەصحابی پێغەمبەر( ﷺ ) دەکا، بۆئەوەی ڕکی کافرەکانیان پێهەڵسێنێ. ئیمامی مالیک (الله تعالی لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: (من أصبح وفي قلبه غيظ على أصحاب رسول الله ، فقد أصابته هذه الآية). **واتە**: هەرکەسێك رۆژەوەی کردو،

لەدڵیاکەمە رکێک بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر هەبوو، ئەوە بێشك ئەم ئایەتە گرتوویەتەوە. واتە: کــافر دەبێت.

(وَمَوَدَّةُ القُربـىَ بِهَـا أَتـَوَسَّلُ) یـانی خـۆشەویستی مەبەست لــە ( القُربـىَ) ئــالوبەیتی پێغەمبەر ( ﷺ ) هــاوسەرەکان و کـچـەکانیتی بە خۆش ویستنی نزیکەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ).

(أَتـَوَسَّلُ) خۆشویستنی سەحابـە و نزیکەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) عیـبــادەتـە کە لە قورئانی پیرۆز الله تعالى دەفەرموویت: (أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) الأحزاب/33. واتــە: هەندێ لە زانـایان پێیان وایە کە لەم ئایـەتـى: (أهل البيت ويطهركم تطهيرا )دا ژنـەکانی پەیامبەر ( ﷺ ) بەرنـاکـەون! خۆ گومانیش لەوەدا نییە کە هەموو بـەرئەکەون، وەک(ئیبن کەسیر) دەڵـێ، چـوکـە: دارشتنی ئایەتەکانی پێشەوە بەم شێوەیە: (قل لأزواجك إن كنتن تردن ..) پاشان هێنانی ئـایـەتی (إنما يريد الله ليذهب ..) بـۆ دواتریش ئـایـەتی (واذكرن ..) پڕ بە پڕ لەگەڵ ئەوانیەتی و هەموو لەگەڵ ئەوان قسە دەکەن، (ئوصول)ییەکانیش یەک دەنگن لەوەدا کە هەر شتێك بەیەقین بەر بکەوێ لەبڕیارێکدا، نابێ جیا بکرێتەوە.



**{عدالـة الصحـابة وأفضليـة الصديق}**

٤_ وَلِـكـُلِّـهِـمِ قَدْرُ عـَلاَ وَ فـَضَائِـلٌ * * لَكِنَّما الـصِـّدِّيقُ مِـنــهـُم أَفـضَلُ

(وَلِـكـُلِّـهِـم قَدْرُ عـَلاَ وَ فـَضَائِـلٌ) یـانی فەزلێکی چاک و تـەواو. (لَـكِـنَّـمـاَ الـصِـدِّيقُ مِـنـهـُم أَفـضَلُ) یـانی بــۆ هەر هەموویـان

قەدرێکی بەرز و چاک و تەواویان هەیە ،بەڵام (الصِّدِّيقُ) لەوانە زۆرترە.

(الصِّدِّيقُ) شێخ ئیسلام مەبەستی سەدیق کێیە..؟ ئەبوو بەکری صەدیقە، گومانی تێدا نیە کە هەوەڵانی پێغەمبەر ( ﷺ ) فەزل و چاکەیەکی کە هیچ شتێک لە کردارەکان پێی ناگات، مرۆڤ چەند کرداری چاک بێت بە قەدەر سەحابە گرینگ نیە بێگومان لە ناو سەحابە هەنێکیان باشترین لە هەنێک باشترینیان کێیە؟

ابوو بەکری صەدیق (أمیر و المؤمنین الأول خلفاء) یەکەم خەلیفەی ڕاشدین ناوی عبدالله کوڕی ئەبو قەحافە، قورئان لە سەردەمی ئەبوو بەکری سەدیق کۆکراوە قورئانی کۆکردەوە لە یەک مسەحفە، خۆشەویسترین کەس لای پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەبوو بەکری سەدیقە.

{ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ. فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (عَائِشَةُ). قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: (أَبُوهَا). قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (ثم عُمَرُ) فَعَدَّ رِجَالًا. بخاري / فضائل الصحابة/ ٣٤٦٢.

(لە ئەبوو عوسمان)ەوە دەڵێ: (عومەری کوڕی عاص) (الله تعالى لێ ڕازی بێت) هەواڵی دامێ کە پێغەمبەری الله( ﷺ ) ناردی بۆ فەرماندەیی سوپای (ذات السلاسل)، هاتمە خزمەتی وتم: کێ زۆر خۆشەویستە لات؟ فەرمووی: (عائشە)وتم: لە پیاوان فەرمووی: (باوکی عائشە) وتم: دوای ئەو کێ؟ فەرمووی: (عومەر)، چەند پیاوێکی ژمارد.

**❖ئەوەیی گرینگە بزانین:**

١_ کە ئەڵێم ئەم سەحابە باشترە لەم سەحابە بەڵکو مانای بە کەم دانانی هەنێکمان نییە، چونکە دەبینین الله تعالى هەندێک لە پێغەمبەرانی بە باشتر داناوە دەفەرمووێت ئام پێغەمبەرانە فەزلی

هەندێکمان داوە بەسەر هەندێکیان بەڵکوو هەندێک لە پێغەمبەران قسەیان کردووە لەگەڵ الله تعالى.

٢_اجماعی عولەماو ئومەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەسەر ئەوەیە کە( افضل)ترین خەڵک لە دوای پێغەمبەری الله ( ﷺ ) ئیمامی ئەبوو بەکری سەدیق و ئیمامی عومەر بوو بەڵام لە بەینی عوسمان و عەلی خیلاف هەیە هەندێک ئەڵێن عوسمان هەندێک ئەڵێن عەلی، هەر کەسێکیش (تاليق) بدات لە خیلافەتی یەکێ لەم چوار خەلیفەیی ڕاشدین بێگومان کەسێکی گومڕایە لە ئەهلی سوننە و جەماعە نییە.

٣_ سوننە و جەماعە وا نیە کە هیچ یەکێ لە سەحابە مەعسوم بووبێت ئەوانەی نزیک پێغەمبەر ( ﷺ ) کەس مەعسوم نییە، بەڵکو جائیزە کەوتبێتنە ناو تاوانیشەوە سەحابەش مرۆڤ بوون بەڵام الله تعالى لێیان خۆش بووە بە تۆبە الله تعالى دەرجەیانی بەرز کردۆتەوە الله تعالى لەوان خۆش بووە بە هۆی کۆمەڵێ چاکە و....... هتد.

٤_جنێودان و تالیق دان لە سەحابە ئەمە کوفرە، ئەمە بەڵگەیە کە (حَديث) ڕەت دەکاتەوە چونکە ئەوانە (حَديث)یان ڕیوایەت کردووە کە نیوەی دینەکەی ئێمە سوننەتە، قسە وتن بە تاک تاکی سەحابە گەر مەبەستیان پێی دینەکەی بوو بێت ئەوە کوفرە، بەڵام مەبەست لە تانەدان(تاليق)دانەکە خودی سەحابەکە بوو بێت نەک ئەم مەنهەجەی کە هەڵگری بووە لەبەر شوبهەیەک کە لە مێشکی بوو بێت ئەوە توشی تاوانی گەورە بووە.



{ القـول في الـقرآن}

٥_ وَأَقُولُ فـيِ الـقُـرْآنِ مَـا جـَاءَتْ بـِهِ** *آيـَاتُهُ فَـهُوَ الكَرِيمُ الْمُـنْزَلُ

یـانی عەقیدە و مـەزهـەبـم لـە قورئانـە، قـورئـان کـەلامـی الله تعالـی دابەزیوە و مەخـلوق نـیـە لە لایـان الله تعالی دەستی پێ کـردووە، پێش ڕۆژیـی قیـامەت دەگـەڕێتەوە بـۆ لایی الله تعالی یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژیـی قیامەتـە قورئان ئەگـەڕێتەوە لای الله تعالی کـاتێ موسڵمانان هەڵدەسـتن پەڕی قورئـان دەکـەنەوە هەمـوویی سپـی بووە قورئـان نـەماوە هیـچ ئایەتێـک نەمـاوە، _کـەلامی الله تعالی هـەم سەوتە و هەم وشەیە،

الله تعالی بە حەقیقی قسـە دەکات وایـی کـرد کـە جـوبـریل گوێ بیستی بێت گوێی لـە سەوتی الله تعالی بووە قورئــانی لێ وەرگرتــووە هەتـا بی گـەیێنێت بـە پێغەمبەری الله (ﷺ) وە لــە جوبریل وەری گرتووە بـە وەحـی وە بێگـومان گـەیاندویەتی بـەو خـەڵکـەش وەک مژدە دەر و تـرسێنەر، مـژدە دەر بـۆ ئەوانـەی ئیمان دەهێنن ترسێنەر بـۆ ئـەوانـەی ئیـمان نـاهێنن، هـەم جوبریل هەم پێغەمبـەر ( ﷺ ) هەردووکیان گەیێـنـەری کـەلامی الله تعالی و قـورئـانن نــە قسەی جوبریل و نـە قسەی پێغەمبـەر( ﷺ )نـییـە بەڵـکو قسە کـەلامی الله تعالی گەیاندویانە، خەڵـکیش ئەو قورئـانە دەخوێنن کـەلامی الله تعالی ، وە دەی خوێنەوە دەی نوسنەوە بـە قەلەمەکانیـان ئەوە وا دەرناچی بلێ کـەلامی الله تعالی کـە بە سەوتی خۆی دەخوێنی و دەنوسێتەوە بلێ ئـەمە کـەلامی الله تعالی نییە، سـەلەف دەفەرمووێ:_( کـەلام کـەلامی الله یە بـەڵام سـەوتـەکـە سەوتـی قورئان خـوێنـەکـەیە) قورئـان لەفظـ و مـانـاکـەش هـەموو هی الله تعالی کـەلام سیفەتێـکی زاتیـە_لە ئەسلا دوو جۆرە سیفەت هەیە..؟

**سیفەتی زاتی**: ئەوەیە کە بەردەوام الله تعالی ئـەم سیفەتەی هەیە.

**سیفەتی فیعلی**: ئـەوە کـە هەر کـات الله تعالـی ویسـتـی لێ بێت ئـەوە ئـەکات.

کەلام سیفەتێکی زاتیە وە سیفەتێکی (فعلی)یشە بەوەی هەر کات ویستی لێ بێت قسە دەکات کەواتە قورئان کەلامی الله تعالی مەخلوق نییە ، قورئان لفظ و ماناکەشی هی الله تعالی ییە ،

**ئەوانەی دەلێن قورئان مەخلوقە:-**

١_ **جەهمیەکان**: بە ڕوونی دەلێن قورئان مەخلوقە، کەلام مەخلوقە نالێن قورئان کەلامی پەروەردگارە.

٢_ **موعتەزیلیەکان**: کەلام پاڵ دەدەن بۆ لایی پەروەردگار ، ئینکاری سیفاتی الله تعالی دەکەن دەلێن قورئان مەخلوقە.

٣_ **کولابیەکان و ئەشعەرییەکانیش**: بانگەوازی مەخلوقایەتی قورئان دەکەن بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نالێن بەڵکو دەلێن: کەلام دوو جۆرە:

**یەکەم** : کەلامی نەفسی نەپیتە نە دەنگە وە ئەوە پاڵدەدەن بۆ لایی پەروەردگار.

**دووەم**: کەلامی لەفزی کە پێکهاتووە لە پیت و دەنگ ئەوەش قورئانە کە پەروەردگار قسەی پێ کردووە.

-وە ئەشعەری و کولابیەکان شوێنکەوتەی عبداللەی کوڕی سەعدی کوڕی کولابی بەسیرین.

ئەمە ڕاست نییە بلێین ئەشاعیرە شوێن کەوتەی (ئەبوو حەسەنی ئەشعەرین) چونکە ئیمامی ئەبوو حەسەنی ئەشعەری لە کۆتایی تەمەنی گەراوە مەزهەبی سەلەف وە کتابێکی گەورەی نوسی لە مەسەلەی (اسماء و سیفات) ئەوانەی خۆیان ئەدەنە پاڵ ئەشعەری ئەلێن ئێمە مەزهەبی ئەشعەرین ڕاست ناکەن، چونکە ئیمامی ئەشعەری خۆی گەراوە

مەزهەبی سەلەف، پەشیمان بوویەوە ئەو کاتە ئیمامی ئەشعەری شوێن کەوتەی کولابیەکان بوون لەسەر مەزهەبی ئەوان بوو.

یەک مەزهەب بوون بۆیە ئەبێ پێکەوە ناویان بهێنرێت، وە ئەڵێن ئەم قورئانە عەرەبییە و کەلامی الله تعالى نییە ئەڵێن الله تعالى بەم کەلامە قسەی نەکردووە بەڵکو مانای کەلامی الله یاخود چیرۆکە لە کەلامی الله، یان دەڵێن قورئان کەلامی الله بەڵام نە بە حرف و نە بە سەوت قسەی نەکردوە ئەم جۆرە قسانەش باطلە و مخالفەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە ، وە ئەوەی بیر و باوڕی سەلەف و شێخ ئیسلام لەسەری ڕۆشتووە قورئان سیفەتێکی زاتیە وەسفدار بووە بە کەلام ، وە سیفەتێکی فعلیە لەگەڵ کێ بیەوێت قسە دەکات.



**{ الإيمان باسماء الله وصفاتة}**

٦_ وَ أَقوُلُ: قَالَ اللَّهُ جَلَّ جَلَالُهُ***وَ المُصطَفَى الهَادِي وَلَا أَتَأَوَّلُ

( أَقوُلُ: قَالَ اللَّهُ جَلَّ جَلَالُهُ) لێرە دا شێخی ئیسلام ابن تەیمیە باسی اسماء و سیفاتی الله تعالى ئەکات، کە لەسەر قورئان و سوننەت بنیادنراوە بە چی بزانین کە ئەمە سیفاتی الله..؟ بەڵکو ئەوە علمی غەیبە بە غەیری قورئان و سوننەت ناگەیت بەم علمە، پێی ئەگەیت بەوەی الله تعالى اثباتی کردووە لە قورئاندا و پێغەمبەر ( ﷺ ) لە فەرموودەکانی ( ناوەکانی الله تعالى (توفیق)ین بواری ئەقڵی ئینسان نادەن بۆ پەی پێ بردنیان، بۆیە پێویستە لە قورئان و سوننەت وەربیگرین نە لێی زیاد کرێ نە لێی کەم کرێ.

( المُصـطَفَى الـهـَادِي) يـانى الله تعالى فەرموويەتى (المُصـطَفَى الـهـَادِي) پێغەمبەرى الله( ﷺ ) {المصطفى} هەلبژێردراوە {الـهـادي} هيدايەت دەرە.

(وَلَا أَتــأَوَّلُ) يـانى اثباتى اسماء و سيفات لەسەر قورئـان و سوننـەت دامەزراوە، بـەبێ ئـەوەى كە (تحريف _ تعطيل_تشبيه_تـكيف):

١_**تحريف**: واتــە نــابێت دەستكارى نــاو سيفاتەكان بكرێت بە بێ كەم و زياد و گۆڕينى سەر (فتحة و ضمة) نــاوەكانى.

٢_**تعطيل**: واتـە (لــە كارخستن) ئەويش بريتيە لـەوەى نـابێ لابردن ئينكارى كردنى نــاو سيفەتەكانى الله بكرێت ئـەو تاقمەى (تأويل) نــاو سيفەتەكانى الله دەكەن جەهميەيـان پێ ئەوترێت.

٣_**تشبيـه**: واتـە چواندن ئەويش ئەوەيـە نـابێ نــاو سيفەتەكانى الله بــە مەخلوقەكانى بچوێنرێت، وەك دەست و چــاو و قـاچى الله تعالى وەك هى دروستكراوەكانى سەير بكرێت.

٤_**تـكيف**: واتــە چۆنيەتى ئەويش ئەوەيە نــابێت لــە چۆنيەتى و حەقيقەت و نــاوەڕۆكى نـاو سيفەتەكان بكۆلێتەوە.

-شێخى ئيسلام ئيبن تەيميە دەفەرموويێت: مـن (تــأويل) نــاكەم مـانــاكەى نــاگۆڕم مەبەستى (تــأويـل) لايى جەهميەكان و مەعتەزيليەكان و غەيـرى ئــەوان، وە ڕاستيەكەى ئـەمەش بـەلاوە لايـى (متەئخرين) لاى ئەهلى تــوسل فقيش كە ئەلێن (تأويل) مەبەستيان تحريفە كە دەيى گۆرن بۆ مانــاكەيترى كە ئەوە نييە، ئـەبێ بلێيت قەولى الله تعالى و پاشان پێغەمبەر(ﷺ ) تحريفيان نــاكەم مــاناكەى نــاگۆڕم.



{ إثبـاتُ مــا أثبته الله لنفسه}

٧_ وَ جـمـِيـعُ آيَـاتِ الصِـّفَـاتِ أُمـِرُّهـَــا***حَقـًا كَـمَـا نـقَـلَ الطـِّرَازُ الأَوَّلُ

(وَ جـمـِيـعُ آيَـاتِ الصِـّفَـاتِ) يــانی ئـەو ئــايەتــانــەی بــاسی سیفاتی الله دەكـات لــە قورئــان و سونــەتدا.

(أُمـِرُّهـَــا) يــانی مــانــاكـەی چۆنـە ئـەوە لـەسەری ئـەڕۆم، بـەڵگەی ماناكە چۆنـە ئـەوا لـەسەری دەڕۆم بلێيت بەس الله تعالی ماناكەی ئەزانێت ئـەوە مەزهەبی سـەلەفە، چۆنـە ئاوا مــانا دەكرێت ڕێک لـەسەر ئـەو (نەسانە) كـە هــاتوون، هيچ دەستكاری ناو سيفاتەكان ناكری وەک الله تعالی دەفەرمووێت:_ (لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ)الشوری/11

{لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ} هيچ شتێـک نيە لەوێنەی ئەو (خوايە)ـە،نــە لــەزاتيا، نــە لــە سيفـاتيا، نـەلـە كرداريا، بۆ خۆی تەنيايەو، لەهەموو شتێک بـێ نيازەو، هەمو شتێكيش نيازمەندە بەو {وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ} ئەويشە بيسەری بينا، بەئاگايە بە وتەی بەندەكانی، بينايە بۆ كاروكردارايان.

(حَقـًا كَـمَـا نـقَـلَ)يــانی بــە ڕاســتی نــەقل كراوە نــەقليـان كردووە.

(الطـِّرَازُ الأَوَّلُ) يــانی سـەرەتــا الطراز بـە مـانـايی الـطرز هــاتووە بە مانای باشترين شت دێت لە شتێكا (الطرز) لـە جلـە بريتيە لــە زينـەيەک كـە بـە خەتێكی ملـەوەن كێشرابێت (الطرز) يانی باشترين ڕێگـا شێخی ئيسلام كـە دەفەرموويت (الطـِّرَازُ الأَوَّلُ) وەک چۆن سەلەفی سالح و زانــايانی سەلەف لـەسەر ئـەوەبوونـە منيش ئاوا ئەڕۆم لەسەر اسماء سيفات، كـە سەلەفی سالح ئيمامی ئەحمد كوڕی حەنبەل و سفيانی سەوری و ئيمامی ماليـک الله تعالی لێيان ڕازی بێت...هتد، سەلەفی سالح لەسەر ئـەو ڕێگايە

ڕۆشتن كە ئیمان هێنانە بە هەموو ئەوەی كە هاتووە لە ناو و سیفاتەكانی الله تعالی ناوی لە خۆی ناوە و وەسفی خۆیی كردوە لە كتابەكەی وە لە سونەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) بەبێ (تحریف_تعطیل_تكیف_تشبهە)_ سەلەفی سالح پەیوەست بوون بە سێ خاڵ لە باسی اسماء و سیفات.

١_ اثباتی هەموو ئەوەی كە الله تعالی اثباتی كردووە لە اسماء و سیفات وە ئەوەش كە پێغەمبەرەكەی ( ﷺ ) اثباتی كردووە، پاشان نەفی كردنی هەموو ئەوەی كە الله تعالی نەفی كردووە لە قورئان و لە فەرموودەیی پێغەمبەر( ﷺ ).

٢_ بە پاك دانانی الله تعالی لەوەی كە بشوبهێنرێت بە مەخلوقاتیەوە لە زاتیەوە لە اسماء و سیفاتدا وەك چۆن لە زاتیەوە ناشوبهێنرێت بە مەخلوقات لە اسماء سیفاتیش دا بەهەمان شێوە.

٣_ هەوڵدەدین كە ڕۆ بچین لە زانینی چۆنیەتی سیفات و هەوڵیش بدەیت هەر نای زانیت.



٨_وَ أَرُدُّ عـهـدَتَمـا إلـى نـُقـَّالِهـا**وَ أَصـُونـُهـا عـَنْ كـُلِّ مـا يُتـَخـَيلُ

یانی هەموو نەسەكانی اسماء و سیفات دەیبەمەوە لای ئەوانەی سەلەفی سالح كە بۆ مانیان نقل كردووە ئەوان ڕێگایان چاكتر و سەلامەترە

بە پێچەوانەی ئـەوانە دوای خەلەف ئـەوان هــاتوون نەقلیان دەکەم وەک ئامانەتی هیچی لێ ناگۆڕم، مـەبەستی ئـەوەیە نەقلی نەسەکانی سیفاتیان کردوە ئیمانیـان پێیەتی و بـە ماناکەشیان و ئەشی پــارێزم لــە هەموو ئـەم شتانەی بە خەیاڵی دادێت و گومــان پێ ئەبرێت، یــانی ئـەم سیفاتەی اثبات بووە بۆ الله تعالی ئەی پارێزم لە هەموو گـومـانـەکان وە لـە (تحریف_تکیف_تنضیل_تحطیل).



**{تـأويل الصفـات احتجـاجاً بتول البشر}**

٩_قـُبـحـًا لـِمَـن نـَبـَذَ الـقُرَانَ وَرَاءَهُ***وَ إِذَا استَدَلَّ يَقُولُ: قَـــالَ الأَخـطَلُ

(قـُبـحـًا)ئـەمە دوعــایە دوعــا و زەمە بــۆ ئـەو کەسـانـەی تەرکی قورئــان دەکەن (نـَبـَذَ الـقُرَانَ وَرَاءَهُ) وە تەرک دەکەن و ئیشی پێ نــاکەن بـە ڕاستی ئـەوانـە بـە ڕێگـایەکی خراپ دەڕۆن وەک دوعایەکی شەڕە لێیــان دەکات.

(وَ إِذَا استَدَلَّ) کاتێک بەڵگە دێنەوە بـە حیسابی خـۆیـان (یـَقـُولُ: قَــالَ الأَخـطَلُ) ئـەوان ئــەهلی بیدع واز لـە بەڵگە هێـنـانـەوە دێنن کە الله تعالی فەرمووی یان پێغەمبەری الله ( ﷺ ) فەرمووی وە نــاو سیفەتەکانیش غەیری ئەوانیش (استدل) بــە چی دەکەن..؟ (بالأقـوال أهلى البــاطـلـة) بەڵگەیان ئەهلی باطلـە وەک ( أخطل)ــی نــەصرانی و غەیری ئــەوان.

(الأَخـطَلُ)کە نــاوی ئـەبوو مالیک بــوو شاعیرێکـی نـەصرانـی بوو شــاعیری ئومـەویـەکان بـوو لــە ســاڵی (٩٥هـ) مردووە یەکێ لەوانە

شیعری دەنوسی جـا ئـەشاعیرەكان (استدل) دەكەن بـۆ قەولی ئـەم شاعیرە بـۆ سەرخستنی باطیلەكە یان لــە بـابەتی سیفەتی كەلامدا كە بیدعـەیـان داهێنـاوە، _بیدعەی (كلام نفساني) یانی كەلامی دڵ چیە.؟

دەڵێن ئـەو قورئــانە لە ڕاستیە كەلامی الله تعالی نییە بـەڵكو مانــای كەلامی الله تعالی یە ئەگەر مـانــاكە لــە نــاو نـەفسی خۆی دایە الله تعالی سیفەتی كەلامی هەبێ كەلامێكی نەفسانیـە مەبەستیان ئەوەیە الله تعالی سیفەتی قسەكردنی نییە بــە لفض و بــە وشە وە ئـەم قورئـانە تەحبیرە لـەم كەلامە ئـەوە وەك مەخلوق تەحبیرە بـەم كەلامەی لـە نـاو و نەفسی الله تعالی دایـە بـە چ بەڵگەیەك بە بەڵگەی قەولــی (الأخطــل).

إنَّ الـكـَلاَمَ لـَفـِـي الـفـُؤَادِ وَ إنـَّمـَا***جـُعِـلَ اللسانُ عـَلـَى الـفـؤَادِ دَلِيـلا

**دەڵێـن:** كەلام لــە نــاو دلایە لــە ئەسلی لە نـاو دڵدایە بـەڵام زبـان كراوەتە بەڵگە بـۆی لـە ڕاستیدا كەلام نەفسیـە لـە ناو دلدایە بـەڵام زبـان لفضی یـە تەحبیری ئـەو كەلامە دەكات، ئینجا ئـەم بیدعەیان دا هێنا قەولەكەشیان قەولی (الأخطــل)ــی نەصرانیـە.

_شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لێرەوە پێمان ئەڵێت كە نەهیمان لێ دەكات لە پشت كرڕنی حەق و وە ئـەمرمان پێ دەكات بە دەست گرتن بە قــورئــان و سونـنـەت شوێنكەوتن وە تێبگۆشێت لەوەی تێدەگـات لـە الله تعالی و پاشان پێغەمبەری الله ( ﷺ ) هــاتووە شوێن سـەلەف بكەوین بـەڵگەی ئـەهلی سەلەف كە قورئـان و سوننـەت ، بەڵام بەڵگەی ئەهلی بیدعە چی و باطلەكان هیچ بە بەڵگەی قورئان و سوننـەت قسە نـاكەن بەڵكو( أقوال) دێنەوە وەك (أقــوال أهـــلی بــاطــل) وەك ئەوەی (الأخطــل) .

_ئیمامی ئەوزاحی دەفەرمووێت: {دەست بگرە بە آثــاری سەلـەف ئـەگەر خـەڵك ڕەتیـان كردیەوە دوور كەوە لە بیر و بۆ چوونـی خەڵكی ئـەگەر بـۆشت برازێنەوە}.



{ الــرؤيــة و الـنـزول}

١٠_ وَالمُؤمِـنُـونَ يــَرَونَ حـَقـًّا رَّبــَّهــمُ***وَ إلــىَ السمَاءِ بِخَير كـَيفِ يَـنـزِلُ

(وَ المُؤمِـنُـونَ يــَرَونَ حـَقـًّا رَّبــَّهــمُ) يــانی هەر كـەسێـك وەسفی ئیـمان تـەواو بوو بێت تێدا كـەسێـكی ئیماندار بێت چونـكە ئیمانداران الله تعالى ئەبینن بە حەقیقەت جا ئـەم وەسفی ئیمانــە ئـەهلی تــاحـەت بێت یــان ئەهلی مەحسیەت بێ یان ئیماندارێـكی كامل یان هەلە هەبێ ، بەڵام بە مەرجێك نەگەیشتبێتە ئەهلی شرك و كـوفر الله تعالى بە چاوەكـانی خۆی ئەبینێ لە بەهەشت ئینجا مەسەلەی بینین مەسەلەیـكی زۆر گرینگە ئەهلی سوننە و جەماعـە اثبـاتی دەكـەن بەلگەشیان قەولی الله تعالى.

١_ (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ )القیامه/٢٢

واتــە:_ دیتنی الله تعالى لە رۆژی پەسڵاندا: لـەرۆژی قیامەتدا دەم و چاوو روخسار گەلێ (واتە: ڕوومەتی باوەڕداران) گەشاوەو پاراوو پرشنگدارە و خۆشیی و شادییان لێ دەبینرێ .

(إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ)القیامه/٢٣

واتـە:_بـۆ پـەروەردگـاری خـۆیــان دەڕوانـن.جـەمـاوەری زانـایـان- وەك لەچـەندین فـەرموودەی ڕەواو (صەحیح) وەرگـیراوە- دەڵێـن:مـەبـەست لـەم ئـایـەتـە ئـەوەیـە كـە لـەڕۆژی قیـامەتدا بەندە صـالْـحـەكان تەماشای خوای خۆیان دەكەن و، بەچاوی خۆیان دەیبینن، وەك چۆن بەئارەزووی خۆیان تەماشای مانگە شەوی چواردە دەكـەن و دەبینن. (ئیبن كەسیر) دەڵێ: رای كۆی هاوەڵان و شوێنكەوتوان (الصحابە والتابعون)یش هەر ئەمەیە، وە هەموو پێشەوایانی ئیسلام پاش ئەوانیش یەك دەنگن تێیدا. پێغەمبەر ( ﷺ ) بـۆ پشتگیری لـەو مـەبەستە دەفەرمووێ: ( إنكم ترون ربكم كما ترون هذا القمر..)فتح الباری:429/13 و مسلم: 439/1 .

٢_الله تعالى دەفەرموویت:( كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ)المطففين/١٥

واتە:_ ئاگاداربن ! بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا لەدیتنی خواوەندیان مەحجووبن و نابیینن . پێشەوا (شافیعی) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دیتن و بینینی خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا پیشەوا (مالیك)یش دەڵێت: كاتێك كە دیتنی زاتی خوا دوژمنانی لێ بێ بەش بكرێت، ئەوا بێگومانە كەزاتی خۆی دەرئەخات بۆ دۆستەكانی، وەك ئەفەرموێ: (وجوه يومئذ ناضرة ،إلى ربها ناظرة )75/22-23.

٣_الله تعالى دەفەرموویت:_( لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ) يونس/٢٦.

واتە:_ بۆ ئەوانەش چاكە دەكەن، پاداشی زۆرچاك و بەهەشت هەیە، وەزیاد لەوەش، واتە: دیتنی ڕووی پڕۆزی خوای میهرەبان و تەماشا كردنیی!

**❖ ئەوانەی لە مەسەلەی بینین لایان داوە دەبنە چەند بەش..؟**

١_ جەهمیەكان و موعتەزیلیەكان شوێن كەوتوانیانە ئەوانە نەفی (رؤيە) بینین دەكەن ئەڵێن الله تعالى نابینرێت بە هیچ شێوەك.

٢_ سۆفیەكان ئەڵێن لە دونیا الله تعالى ئەبینرێت.

٣_ ئەهلی سوننە و جەماعە اثباتی بینینی الله تعالى دەكەن، ئەڵێن لە دوو شوێن الله تعالى ئەبینرێت لە ڕۆژیی قیامەت و لە بەهەشت نەفی ئەوانە دەكەن ئەڵێن الله تعالى نابینرێت قەولیشمان قەولی الله تعالى:_( وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ

إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ).

**واتــــه** :_مووسا دەخوازێ پەروەردگاری ببینێ: ئەوسا کە موسا هات بۆ شوێنی موناجاتەکە لە گەڵمان و پەروەردگاری کەوتە قسەو گفتوگۆ لە گەڵی وگوێی لەدەنگییەوە بوو موسا بۆپتر دڵنیایی وخۆشەوستیی بە پەرۆشەوە گوتی: پەروەردگارم! خۆتم پێنیشاندە، زۆر ئارەزوومە بتبینم خوا فەرمووی: مووسا! هەرگیز لەم دونیایەدا تۆ ناتوانی بمبینێ، چونکە بونیەی ئادەمیزادی ئێستای ئەم دونیایە، توانای بینینی خوای نیە بەڵام لەم کێوە بڕوانە، من خۆمی نیشان دەدەم، جا ئەگەر ئەو کەبونیەی لە توبتەوترە، لە جێی خۆی ماو، نەبزووت، ئەوساش تۆدەتوانی بمبینی، ئەگینە نامبینی، جا هەرکە پەروەردگاری بۆ کێوەکە خۆی دەرخست هەر بە جارێ کێوەکەی رووناکردەوەو هەپروون هەپرووونی کرد،و مووساش بێهۆشکەوت و بووراپەوە ئینجا کە بەهۆشهاتەوە ، وتی خوایا! پاک وخاوێنی و بێخەوشی هەر بۆ تۆیە، هەر شتێکیش تۆ لەکەدار بکا، دوور ڕاتدەگرم لێیی و، پەشیمانیشم لە داواکەم ومن یەکەمین کەسم لەناو بەنی ئیسرائیلییە بڕوادارەکاندا ئیمانم.

بە گەورەیی و دەسەڵاتی تۆیە. بەڵێ.. زۆربەی ڕاو بۆچوونی زاناکان لە سەر ئەوەیە کە: هیچ کەسێک لەم جیهانەدا خوای گەورەی نەدیتوەو نایشیبینێ، تەنانەتی دیتنەکەی پەیامبەریش ( ﷺ ) دەڵێن هەر بە دڵ بووە، نەک بە چاوی سەر. (ئیبن کەسیر) دەڵێت: بێژەی (لن) لەم ئایەتەی (لن ترانی)یەدا لای زۆرینەی زاناکان بۆتە کێشە، چونکە وشەی (لن) بۆ بەربەستکردنە لەرووودانی هەرکارێك بە هەتاهەتایی، (نەحوو)زانەکان دەڵێن (لنفی التأبید). موعتەزیلەکانیش ئەمەیان کردوتە بەڵگەی خۆیان کە: خوا نە لە دونیادا، نە لە پاشە رۆژدا نابینرێ، بەڵام ئەمە لە هەموو بۆ چوونەکان لاوازترە، چونکە گەلێ فەرموودەی (موتەواتر) هاتووە کە: موسڵمانان لەقیامەتدا خوا ئەبینن، دیسان ئایەتی (لا تدرکه الأبصار ) یشیان هەر بە بینین

لێکداوەتەوە، واتە: بەلای ئەوانەوە قەت خوا نابینرێ، نە لــە دونـیـادا؛ نـە لـە پاشە رۆژدا، جا بـۆ زانـیاریـی زیـاتـر لـە بـارەی ئـەم مـەسـەلـەوە، سـەرێ لـە سوورەتی (نەجم) بدە، چونکە لەوێ چاکتر رونکراوەتەوە.

(وَ إلــىَ الـسـمـَاءِ بِـخَـيـر كـيَـفِ يـَنـزِلُ)یـانی دابەزینی الله تعالی بـۆ ئـاسمانی دونیـا لە هەمـوو شەوێک دا چونکە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی ئەویش زانـاترە بـە الله تعالی دەفەرمووێت الله دا ئەبەزێتە ئــاسـمانی دونیـا لـە سێ یـەکـی شـەو ئـاخیرماوە { یـنزل ربـنــا في الثـلـث الأخـيـر} الله تعالی دەفەرموویت کــێ داوام لێ دەکـات بـا وەڵامـی بدەمەوە کێ دوعا دەکـات با جوابی دوعاکەی بدەمەوە  کێ داوای شتێکم لێ دەکـات با پێی بدەم، کێ داوای لێخۆش بوون دەکـات بـا لێـی خـۆشبم ئەمەش مــەسـەلــەی ( تـنـزل)  ئەهلی سوننـە و جـەمـاعـە بڕوایان هەیە کە الله تعالی دائەبەزێتە ئاسمانی دونیا ، دابەزینێک بێ (تحريف_ تمصيل_ تـكـيف_  ) هەر کـەس مانای بگۆڕێ تەفسیری ( نــزل) کات ئەوە مەخالفەی عەقیدەی سەلەفـە یان بلێ علـمی دا ئەبەزێت لە سێ یەکی شەو وە نــابێت و جـائیز نیـە بیر کـەینەوە لە چۆن دابەزینی الله تعالی.



**{القول في بعض مسائل تتعلق باليوم الآخر}**

١١_وَ أُقِرُّ بِالمِيزَانِ وَ الحَوضِ الَّذِي** *أَرجُو بِأَنِّي مِنهُ رَيًّا أَنهَلُ

(وَ أُقِرُّ ) یانی ئەوە عەقیدەی منە کە أعتقاد بە میزان،

(وَ أُقِرُّ بِالمِيزَانِ) یانی کار پێکردنەکان وەزن دەکرێت بە میزانێک ، کارپێکردنەکانمان_ نامەی کردەوەکانمان_ لەشمان هەموو وەزن دەکرێت و دەخرێتە ناو تەرازوو بەلگەشمان فەرموودەی پێغەمبەرە( ﷺ ) کە مرۆڤەکان میزان دەکرێت، کاتێک (ئیبن مەسعود) بەسەر دارەکەدا سەرکەوت قاچی بەدەرکەوت قاچێکی باریکی پێوە بوو ئەوە بوو هەنێک لە سەحابە پێکەنین بە قاچی باریکی پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویی بە چی پێ ئەکەنن ئەم قاچە باریکە وەزنی لە میزان بەرزترە لە (ئوحود) ئەلێ مرۆڤی وا قەلەو هەیە لە ڕۆژیی قیامەت وەزنی بە قەد بالە مێشولەیەک نابێت، بە قەلەو لاوازی نیە ئیمان مرۆڤەکان قورس دەکات.

کەواتە ئیمان بە میزان ثابتە بە قورئان و سوننە بە اجماع بەلگەیی قورئان الله تعالی دەفەرموویت:-

١_(وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ )الأنبياء:٤٧

**واتە**:_ بێگومان ڕۆژی قیامەت ئێمە تەرازووی بەرامبەر دادپەروەریی دائەنێن و کردەوەکانیانی پێ ئەکێشین.

٢_ (وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُ) الاعراف/٩

**واتە** : کەسێکیش کە تای تەرازووی کاروکرداری سووک و بێ بەهابوو، واتە: خوانەناس بوو.

٣_(وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ) الأعراف/٨

**واتــه:** وه كێشانەو لێكدانەوەی كاروكردەوەی گشت ئەوخەڵكانە، لەو رۆژی قیامەتەدا بەڕاستیی و دادگەرانە دێتە پێش و، ستەم لەهیچ كەسێش ناكرێت ئینجا هەر كەسێك تای تەرازووی كردەوەكانی گران و قورس بێت لای خوا، واتە: كاروكردەوەی دنیای چاك بێت، دیارە هەر ئەوانە سەرفراز و بەختەوەرن.

(وَ الـحَـوضِ) یـانی ئیمان بـە حەوز كە الله تعالی تایبـەتی كردووە بە پێغەمبەرەكەی وە ئەهلی قورئـان و سوننـە لـەم ئـاوە دەخۆنەوە وەك الله تعالی دەفەرمووێت:

( إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ) الـكوثر/١

**واتــه:**_ بەڕاستی ئێمە چاكەو خۆشی و خێرێكی زۆر گەورەمان بەتۆ بەخشی كەمایەی سەر بەرزیی دنیاو قیامەتتە، یەكێ لەوانە رووبارێكی تایبەتە لەبەهەشتدا، وەك ئیمامی (بوخاریی) دەڵێ، پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێت: لـە دوای من بە زولم ستەمی بێ بڕوایان دەگـەن سەبر و ئـارامبگرن تا دەگەنەوە بە من لەسەر حەوزی كەوسەر (مسـلم_بخـاری).

**❖وەسفی ئــەم حەوزە لە سونـەدا هــاتووە.**

حەوزی كەوسەر ئـەو حەوزەیە درێژیەكەی مانگـە ڕێیەكە پـانیەكەی مانگە ڕێیەكە ئـاوەكەی سپیترە لـە شیر، شـریـنـترە لـە هــەنگـوین، ئـەو قـاپەی موسڵـمانـان ئـاوی پێ دەخـۆن بــە قەد ژمــارەی ئەستێرەكانی ئـــاسمـانە هــەر كـەس یەك قومی لێ بخوات هەرگیز تێنوی نابێت.

(أَرجـُو بِـأَتـِّي مِنـهُ رَيـَّا أَنـهَلُ) شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ئەڵــێ ئومێدم وایــە کـە من یەکـێ بم لەوەی ئەم ئاوە بخۆمەوە تێر ئاو بخۆم، وە ئــەوانەشی ئینکاری حەوز دەکەن لەم ئاوە ناخۆنەوە ئەهلی بیدع لەم ئـاوە نــاخۆن و بێ بەش دەبن.



**{الصراط و حال الـنـاس عليـه}**

١٢_ وَكَذَا الـصِّرَاطُ يُمـَدُّ فـَوقَ جـَهَنـمٍ**فَمُسلِمٍ نـَاجٍ وَ آخـَرُ مـُهمَلُ

(وَ كَذَا الـصِّرَاطُ يُمـَدُّ فـَوقَ جـَهَنـمٍ) یـانی چۆن بڕوام بە حەوز و میزان و بینینی الله تعالى هەبوو ئاواش بڕوام بە صــیراط هەیە کە لــەسەر جەهەنەم درێژ دەکرێت هەیە سەڵامەت دەبێ و ڕزگاری دەبێت هەشە دوا دەکەوێت، (بـەیان) ئەهلی سوننـەو جەماعەت دەربــارەی صــیراط بە بەلگـەوە، هیچ کـەس نیە لە ئێوە بەڵکوو هەر ئەبێ بەسەر جەهەنەم دا بڕوات ئەم تێپەڕینە الله تعالى بڕیاری داوە بڕیاری الله تعالى ڕەت ناکرێتەوە، لـە فەرموودەیی پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێت:_ جسرێک بەسەر جەهەنەم دا هەیە من یەکەم کەسم تێئەپەڕم بەسەریدا دوعــایی پێغەمبەران لــەم کاتە دا خوایە سەڵامەتمان کەیت دوبارە دوبارە ئـەڵێن لـەم جسرە بپەڕنـەوە، دەفەرمووێت لەسەر ئـەم جسـرە کۆمەڵێک قولاب هەیە لــە ( شـۆک سەعدان) ئەچێت ڕووەکـێکی خــاوەن دڕکە وتــی: بینیوتــانە شۆک سەعدان وتیــان : بــەڵێ بینیومانە ئەی پێغەمبەری الله ( ﷺ ) ئـەڵێ ئەم قولابانەی جسری صیراط وەک ئەوە وایــە بەڵام گەورەیەکەی بەس الله تعالى ئەزانێت بەس لە شێوەدا وەک شۆک سەعدانە ڕووەکێکی خــاوەن دڕکـە بەردەوام دەگردرێتە خەڵکی جا هەیە بەری ئەکەوێت ئـەکەوێتە

جــەهەنەم هەشە بریندار ئەبێت، هەیە بەری ناکەوێت سەڵامەت ئەبێ ، بە پێی کردەوەکانی خۆیان ئەم قولابەیان پێ ئەکەوێت هەیە بەری ئەکەوی بریندار ئەبێ ئەبورێتەوە هەڵئەسێتەوە بەرنابێتەوە (بخـاري _ مسلم).

کەواتە صیراط جسرێکی مەحنـەوی نیە هەست پێ کراوە بەسەریا دەڕۆیت خەڵکی دەڕۆن بەسەریا بە پێی کردەوەکانیان، هەیە ئاگر بەری ناکەوێ یەکسەر تێ ئەپەڕێت هەیانە وەک هەورە تریشقە دەڕوات، هەیە وەک با، هەیە وەک چاو تروکانێک تێ ئەپەڕێت بەسەر پردەکە، هەیە ڕزگاری نابێت.

(فـَمُسلِم نـَاجٍ وَ آخـَرُ مـُهمـَلُ) وە دڵنیابن کە گەیشتن نییە بە بەهەشت ئیلا بەسەر جسری صیراط نەبێت، کەس ناچێتە بەهەشت ئیلا بەسەر ئەم جسرە ئەبێت.

**{الـجنـة والـنـار}**

١٣_وَالـنـَّارُ يَصلاَهَا الشَّقِيُّ بِحِـكـمـَةٍ***وَكَذَا التَّقِي إلى الجِنَانِ سـَيـَدخـُلُ

(وَالـنـَّارُ يَصلاَهـَا الـشـَّقِـيُّ) یانی ئاگر ئەوانەی تێدەچن کە گوێ نادەن بە فەرمانی الله تعالی و پاشان پێغەمبەر( ﷺ ) ئەوانەش کە ئیماندارن بەرەو بەهەشت ئەڕۆن لەم بەیتە باسی بەهەشت و جەهەنەم ئەکات، الله تعالی دەفەرموویێت:( فَأَنْذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ) الليل/١٤ **واتـە**: دۆزەخ هەر کەللە رەقانی تێدەچێت: ،جا من ئێوەم ئاگادار کردووە (لەسەر زمانی پێغەمبەر ( ﷺ ) بەئاگرێك دەسووتێ گر دەسێنێ، پێغەمبەری خوا وتاری

دەخوێندەوە دەیفەرموو: ( إن أهْوَنَ أهلِ النار عذابا يوم القيامة رَجُل تُوضَعُ في أخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتانِ يَغْلِي منهما دِماغُهُ )فتح البارى: 424/11. **واتە:** بێگومان سووکترین سزا بۆ خەڵکانی جەهەنەمیی رۆژی قیامەت، سزای پیاوێکە دوو پشکۆ دەخرێنە ژێر هەردوو پاژنەی پێیەوە، مێشک و دەماخی پێیان دەکوڵێ!

(بِحِكْمَةٍ) یانێ کەسانێک لایان داوە بۆ ئاگر دەڕۆن بە دڵ و حیکمەتی خۆیی، وە بۆ بەهەشت دەڕۆن بە ڕەحمەت و فەزلەتی خۆیی ، کەواتە مەخلوقی الله بێگومان یەکسان نین الله تعالى کە خالقە کە حەکیمە ، الله تعالى ئەهلی ئیماندار و ئەهلی شەڕ یەکسان ناکات چونکە کردارەکانیان یەکسان نەبوو جەهەنەم و دۆزەخ مەخلوقی الله تعالى ئیستا بوونیان هەیە فەوتانیان بەسەر نایەت ئەوانەی ئەهلی بەهەشت و جەهەنەمن بە هەتایی تێدا ئەمێنەوە هەموو تێدا لە حیکمەت و لە عەزاب بە کۆڕای ئەهلی سوننە و جەماعەت.

(كَذَا التَّقِي إِلَى الجِنَانِ سَيَدْخُلُ) کافر لە جەهەنەم دەمێنێتەوە ئەوە عەزابەکەیی، ئیماندار لە بەهەشت دەمێنێتەوە ئەوە نیعمەتەکەی کۆتای بەسەر نایات بەلگەش قورئان و سوننە بە پێچەوانەی (موعتەزیلیەکان) کە بڕوایان وایە ئیستا بەهەشت و جەهەنەم نییە الله تعالى ڕۆژیی قیامەت دروستی دەکات.

عەقیدەیان مخالفەی قورئان و سوننەتە، الله تعالى دەفەرموویت:( فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ) الشورى/٧ **واتە:** خەڵکەکەش دەبنە دوو دەستە، دەستەیەکیان لە بەهەشتدان و، دەستەیەکیشیان لە دۆزەخدان، **واتە:** بڕواداران لە بە هەشتتان و، بێ بڕوایانیش لە دۆزەخدا، خوا لەجێگایەکی تردا - لە بارەی سەختی ئەو رۆژەو ، زیانمەندی دەستەیەک لە مەردم تێیدا دەفەرموێ: (يوم يجمعكم ليوم الجمع ذلك يوم التغابن ). کەوابوو خوای میهرەبان ئەو مەسەلەیە (خەڵکەکە دەبیچتە دوو دەستە) بڕیوەتەوە، بۆیە

پێغەمبەر جارێ تەشریفی هات و دوونامە بەدەستیەوەبوون و، فەرمووی: ئەمەی دەستی راستم لەلایەن رب العالمین دەرچووەو ناوی گشت خەڵکانی بەهەشتیی، باب و باپیریان و، ناوی هۆزو خێڵیانی تێدایە و، ئیتر کەم و زیاد ناکات، ئەمەی دەستی چەپیشم ناوو نیشانی تەواوی گشت جەهەننەمییەکانی تێدایەو، هیچ زیادو کەم ناکــات. پێشەوا ئەحمەد.



## {فتـنــة الـقبـر و عـذابـة}

١٤_ وَلِـكُـلِّ حَـيٍّ عَـاقِـلٍ فـي قـَبـرِهِ** *عَـمَـلٌ يـُقَـارِنـُهُ هُنَاكَ وَسـُأَل

بـۆ هەموو کەسێ کە زیندوو ئاقل بێ لە قەبرەکەیی دا کردەوەکانی هــاوڕێیەتی لـەوێ پرسیارمان لێ دەکرێت ، بەرزەخ (قەبر) ئــەم ژیـانەیە کە بەیـنی دونیـاو قیامەت ، وە ئەوەی کە لە قەبر ڕوو دەدات لە پرسیار لــە عەزاب لە نیعمەت ، مەزهەبی سەلەف بڕوایان وایە مرۆڤ کە دەمرێت یــان لــە نـاو نیعمەت دایە لە قەبرەکەی یـان لـە عەزاب دایــە وە ئەمەش بەسەر ڕوح جەستە دا دێت کاتی ڕووح جیا دەبێ لە لاشە بەس ڕوح دەمێنی ئەوە یان لە ناز و نیعمەت دایە یان لـە عەزاب دایـە جار جار پەیوەندی هەیە بە لاشەوە ئەوە یان خۆشی دەکێشێ یان عەزاب، بـەڵام کاتێ ڕۆژی قیامەت دێت الله تعالی ڕۆح دەگەڕێنێتەوە بـۆ لاشەکان هەڵدەسنەوە لە قەبرەکانیان کەواتـە ژیـانی بەرزەخ ئـەو ژیانەیە ئێمە دەمرین و ڕوحەکانمان دەچێتە ژیانێکترەوە لە ژیانێک جیا لەم ژیـانـە، وە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە کتابــی ( مجمع الفتـاوى ابن تيميه) بـەڵگەی زۆرە لەسەر اثبــاتی قەبر، وە ژیـانی بەرزەخ ژیانێکی غەیبی و ڕوحیە لاشە نییـە ئەم لاشە لە دۆزەخ نییە بەڵکوو ڕۆحـە ئـەو سزایە دەکێشێت.

**{عقيـدة الأئـمة الأربعة}**

١٥_هـذَا اعـتـقِـادُ الـشـَّافِـعـي وَمـالِـكٍ***وَأَبـي حـَنِـيفَـةَ ثـُمَّ أَحـمـدَ يـُنـقَـلُ

(هـذَا اعـتـِقـَادُ) يــانى جوابى پرسيارەكە بـۆ ئـەو كەسەى پرسيــارى لێ كردم دەربــارەى عەقيدەى شێخى ئيسلام ئـەوەى كە نوسيويەتى لەم مەنزومـە لـەم(قصيده اللامية) لـە ڕاستى دا مەزهەبـى (الأئـمة الأربعة) هەموو لەسەر يەك مەزهەب بوون تەنها ئەوە نەبێت هەندێك مخالەفەى ئەبوو حەنيفە هەيە هەندێك هەڵەى هەيە ، هەڵــەى (اعـتـقـاد) كە ئەهلى علم باسيان كردووە ئيمامى عبدالله كوڕى ئيمامى ئەحمەد لـە كتاب سنەدا فەسلێكى داناوە دەربارەى هەڵەكانى ئەبوو حەنيفە زانــايان باسيان كردووە كە مخـالەفەى هەيە لە ئەهلى سوننـە و جەماعـە نييە.

پێنــاسەى بالأئـمة الأربعة:

(الشــافعى) لـە ساڵى (١٥٠ هـ) لـە دايك بووە نــاوى مەحمدى كوڕى ئيدريسى شافعيـە لــەم ساڵەى ئەبوو حەنيفە وەفاتى كرد شافعى لـە دايك بوو بــە هەتيوى لەسەر پەرشتى دايكى دا ژيانێكى نارەحتيان هەبوو ئيمام شافعى(الله تعالى لێی ڕازى بێت) حوجـە بـووە لــە للغـە علمێكى گـەورە بووە لــە للغـە لـە اصول لـە نەحو لـە فقهـدا لـە فەرموودە دا لـە قەولـەكانى **دەفەرموويێت:-**

_ فێربوون و طـلـب و داخـوازى كردنى عـلم گـەورەترە لە نوێژى سوننەت.

_ وە دەفەرموويێت ئەبێ بـەو پەڕى توانــا هەوڵ بدەيت بۆ بــە دەست هێنـانى زانست كەم تەرخەمـى نــەكەن ئـارام بگرن لەسەر هــەموو كۆسپ و نــارەحەتيەك خاوەنى دڵسۆزى و نيەتێكى پاك بن هەردەم داواى يارمەتى لە الله تعالى بكەن چونكە بە بێ كۆمەكى الله تعالى هيچ خێر و چاكەيك دەستگير نابێت.

_ ئەفەرمووێت هیچ شتێک نیە مرۆڤ لە اللە تعالی نزیک بکاتەوە دوای نوێژە فەرزەکان و شتە فەرزەکان بە قەد ( طالب علم)

**ئیمامی شافعی شەوی کردبوو بە سێ بەشەوە:**

_ سێ یەکی یەکەم خەریکی نوسین بوو ئەی نوسی.

_ سێ یەکی دووەم نوێژی دەکرد.

_ سێ یەکی سێیەم دەخەوت.

لە شەوی هەینی لە دوای نوێژی مەغریب وافاتی کرد (رحمة اللە).

(ئیمامی مالیک) ناوی تەواوی ئەبوو عبداللە مالیکی کوڕی ئەنەس کوڕی ئەبوو عامر لە مەدینە لە دایک بووە لە ساڵی (٩٣ھـ) لە ماڵێک لە دایک بووە کە مەشغول بوون بە علمی حەدیس و ئاثار ئیمامی مالیک تابعی تابعین بووە، علمی وەرگرتووە لە ئیمام نافع لە یەحیا کوڕی سەعید .....هتد.

**ئەوانەی علمیان لێ وەرگرتوە:** ئەبوو حەنیفە و مەحمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی و سەوری..هتد.

**دەربارەی ئیمام وتراوە:**

نەسائی فەرموویی: یەکێ لە پارێزەرەکانی فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیمامی مالیکە.

ئیبن موبارەک فەرموویی: ئەگەر پێم بڵێن پێشەوایەک بۆ نەتەوە هەلبژێرە ئەوا مالیک هەڵدەبژێرم.

یەحیای کوڕی سەعید فەرمووی: مالیک پێشەوای باوەڕدارانە لە فەرموودەدا.

**لە وتەکانی ئیمام:**

ئـەگەر پیاو مەدحی خۆی کرد جوانی دەم و چاوی نامێنی و ئەڕوات.

زانسـت نورێکە الله تعالی لـە ناو دڵـی مروڤ دای ئەنێت زانست بە زۆری ڕیوایەت کردن نییە.

لـە ساڵـی (١٧٩هـ) وەفـاتی کردووە لە بەقیع لە مەدینە منەوەرە نێژراوە.

(ئەبوو حەنیفە) نـاوی تەواوی نوعمانی کوڕی سابت لـە ساڵی (٨٠هـ) لە دایک بدە لە کوفە لە یەکێ لە شارە گەورەکانی عیراق، هەندێک ئەڵێن سەحابەی نە دیوە هەنێک ئەڵێن دیویەتی بەس ڕیوایەتی نیە لە سەحابەوە لە ساڵی ( ١٥٠هـ) وەفاتی کرد.

(ئیمامی ئەحمد حەنبەلی) ئیمامی ئەهلی سونە شێخ ئیسلام نـاوی تەواوی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی کوڕی هیلال شەیبانیە، سـاڵی (١٦٤هـ) لە دایک بووە ببە هەتیمی لە ژێر سەر پەرشتی داکی دا طالب علم کردووە کاتێ کە (١٥) سالان بووە.

**وتراوه دەرابارى:**

ئيمامى شافعى فەرموويەتى: ئەحمەد ئيمامە لە فەرموودە ئيمامە لە زمـان ئيمامە لە دونيا وەيستى.

ئيمامى دارمى فەرموويەتى: تا وەكوو ئيستا نەم بينيوە كەس وەك ئيمام ئەحمەد فەرموودەى لەبەر بێت.

ئەبوو حاتەمى فەرموويەتى: ئەگەر بينيتان يەكێ ئيمامى ئەحمەدى خۆش بووێت ئەوە لەسەر ڕێبازى سوننـە و جەماعەيە.

**لــە كتابەكانى:**

_ السـنـن في الفقه

_ الزهد

_ اصول السـنـه

....هتد

لــە ســاڵى (٢٤١هـ) وەفــاتى كرد.

(يـُنـَقـلُ) يــانى ڕيوايەت كراوە لــەوانـە نقل كراون.



١٦_ فـَإنِ اتـبـعَـتَ سـَبـِيـلـَهـُم فـمـُـوَفـَّقٌ***وَإنِ ابـتـَدَعـتَ فَمَا عَلَيك مـُعـَوَّلُ

(فـَإنِ اتـبـعَـتَ سـَبـِيـلـَهـُم فـمـُـوَفـَّقٌ) ئـەگەر تـۆ شوێن ئەوان بكەويت شوێن بير و ڕێگـای ئـەوان بكەويت كەسێكی ساليحـی، يـانی شوێـين ڕێگـای زانـايـان بكەويت ئەوە توفيق دراوی بۆ حەق، لێره شێخ بانگەوازی خەڵك ناكات بۆ تەقليد بەڵكو بۆ شوێن كەوتنی سالحين بانگەواز دەكات، ئـەگەر شوێن وێنەی عەقيدەی سەحابە بكەوين ئـەوە هيدايەت دراوين بەڵام گەر وەك مەنهەج و عەقيدە سەحابە نەبێ گومڕا دەبين هيدايەت دراوين كاتێ شوێن سەحابە ئەكەوين گەر پشت كرد لەمانە ئەوە لە نـاو مەنهەج و عەقيدەی فيرقە گەری دا ئەبيت هۆيی دروست بوونی فيرقە گەريش ئەوەيە لادانە لە مەنهەج و عەقيدەی سەحابە.

(وَ إنِ ابـتـَدَعـتَ فـَمـَا عـَلـَيـكَ مـُعـَوَّلُ) يـانی ئەگـەر مخـالـفەی ڕێگـای ئـەوان بكەيت شتێك دا بهێنی پێچەوانەی ئەوان بيت، حيساب بۆ قسەكانت ناكرێت بە ئەهلی سەلەف هەژمـار نـاكرێيت.



